Zakho Centre
for Kurdish Studies



# دیوانا مەلا سلێمان دۆسکی

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن
د. فاخر حەسەن گولی

# دیوانا

# مەلا سلێمان دۆسکی

مەلا سلێمان ئیبراهیم سلۆ بەرۆشکی- دۆسکی

١٩٤١-٢٠٠٩

ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن

د. فاخر حەسەن گولی

Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکولینێن کوردی

سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

| | |
|---|---|
| پەرتووك | دیوانا<br>مەلا سلێمان دۆسکی |
| ڤەوژارتن و بەرهەڤکرن | د. فاخر حەسەن گولی |
| چاپ | ئێکێ/ ٢٠٢٢ |
| دیزاین<br>بەرگ | دیـــار عـبـدالله<br>جەگەرخوین جەمیل<br>وارهێل عبدالباقی |
| ISBN | 978-9922-9169-9-6 |
| ژمارا سپاردنێ | D- / ٢٦٥٤ / ٢١ |




Zakho Centre
for Kurdish Studies
سەنتەرێ زاخۆ بۆ ڤەکۆلینێن کوردی

zcks@uoz.edu.krd +964 750 471 0863
Iraq- Kurdistan region, Zakho- Univesity of zakho

## پێشەکی

مەلا سلێمان دگەل کارێ خوە یێ مامۆستایی و مەلاتیێ ب کارێن ئەدەبی ژی ڕابوویە، ب ڤەهاندنا هەلبەستان خزمەتەکا باش پێشکێشی ئەدەبیاتا کوردی کریە، سەرەڕای ئەوێ چەندێ کو مەلا بوویە، لێ چەندین هەلبەستێن نیشتیمانی و وەلاتپارێزیێ ڤەهاندینە. د ئەڤێ پێشەکییێدا هەول هاتیەدان کو ب شێوەیەکێ گشتی باسێ ژیاننامەیا هەلبەستڤانێ ئەڤێ دیوانێ هەر ژ دایکبوونێ هەتا مالئاڤاییێ و پێداچوونەکا گشتی د دیوانێدا بهێتەکرن.

### هەلبەستڤان ژ لایێ جڤاکیڤە:

(مەلا سلێمان ئیبراهیم سلۆ)، ل سالا (١٩٤١)ێ، ژدایکبوو، ژ بنەمالا (تەمەر)ی سەر ب گوندێ (بەڕۆشکا سەعدوینی) دەڤەرا (دوسکیان)ڤەیە، بابێ ئەوی (ئیبراهیم)، ژ گوندێ ناڤبری چوو بوو دەڤەرا زاخۆ و ل گوندێ باکرمان سەر ب ناڤچەداریا ڕزگاری ئاکنجی و خێزان پێکهینابوو، هەر ل وێرێ (مەلا سلێمان)ی چاڤێن خوە ل دونیایێ ڤەکرن. ژیانا هەڤژینیێ ل گەل خانم (حەفسە عەلی حسێن) پێکهینابوو و خودایێ مەزن پێنج کوڕ (عەبدولکەریم، ئازاد، نەوزاد، بەهزاد و زیاد) و چار کچ (نەسرین، پەروین، نازەنین و چیمەن) ب ئەوان بەخشی، مەلا سلێمان ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٩/٦/٢٥)ێ، ل باژێرێ زاخۆ مالئاڤایی کر.

### قوناغێن خواندنا هەلبەستڤانی:

(مەلا سلێمان) د ناڤ دیندار و خودێناسێن باکرمانێدا مەزن ببوو، هەر ژ زارۆکینیا خوە دەست ب خواندنا وانەیێن ئایینی ل دەڤ زانا و مەلایێن

دەڤەرێ کر، ب هاریکاریا خودایێ مەزن و خەمخۆری و حەزا زێدەیا ئەوی بۆ خواندنێ و پشتەڤانیا دایك و بابێن ئەوی د خواندنێدا دبیتە کەسەکێ سەرکەڤتی، ناڤبری بەردەوام دویڤچوونا بدەستڤەهینانا زانستێن ئایینی دکر، هەتا خواندنا ئەوی گەهشتی ئاستەکێ بلند و شیا ئیجازا مەلاتیێ ل دەڤ (مەلا حسێن مارۆنیسی) وەرگریت، ببیتە مرۆڤەکێ شەهرەزا د بیاڤێ ئایینیدا.

پشتی شۆڕەشا (١٤ تەمموزا ١٩٥٨)ێ، ب ڕێبەریا (عەبدولکەریم قاسم)ی کو داوی ب پادشاهیا عیراقێ هێنایی، (مەلا مستەفا بارزانی) ژ ڕۆسیا زڤڕیەڤە کوردستانێ و ل دەستپێکێ ڕەوشا کوردستانێ باش بوو، هەر د ئەڤی کاودانیدا ژبەر کێمیا مامۆستایان هەولەك هاتەدان کو خۆلەکا بەرهەڤبوونا مامۆستایان بهێتە ڤەکرن، هەر ب ئەڤێ مەبەستێ ل سالا (١٩٥٩ز)ێ، خۆلەك ژلایێ وەزارەتا مەعارفا عیراقێ یا ئەوی سەردەمی بۆ کومەکا خواندەڤانان ل هەولێرێ هاتە ڤەکرن و مەلا سلێمان ژی ئێك ژ ئەوان کەسان بوو ئەوێن پشکداری د ئەڤێ خۆلێدا کری، ناڤبری شیا ب سەرکەڤتیانە خۆلا خوە ب دویماهیك بینیت و باوەرنامەیێ بدەستخوەڤە بینیت.

**قوناغێن مەلاتی و مامۆستاییا هەلبەستڤانی:**

ل سالا (١٩٦٠)ێ، (مەلا سلێمان) وەك مامۆستایێ سەرەتایی هاتە دامەزراندن و بۆ جارا ئێکێ ل گوندێ (مەلا عەرەب)ی ل دەڤەرا (گولیان) دەست ب وانەدانا خوەندەکاران کر، لێ پشتی شۆڕەشا ئەیلولێ دەستپێکری زڤریەڤە دناڤ باژێرێ زاخۆدا، لێ حکوومەتا عیراقێ کۆمەکا ئەوان مامۆستایێن گۆمان ل سەر هەی ژ زاخۆ بۆ دەڤەرێن دویر ڤەگۆهاستن، ژبەر ئەڤێ چەندێ مەلا سلێمان بۆ گوندەکێ سەر ب ناڤچەداریا (شرقات)ێ پارێزگەها نەینەوا هاتە دویرکرن، ل شوینا ئەوان مامۆستایێن عەرەب

ڤەگۆهاستنە كوردستانێ، لێ پشتی ترسا كوشتنێ ل دەڤ مامۆستاییێن عەرەب پەیدا بووی، حكوومەتا عیراقێ ل سالا (١٩٦٥)ێ، نەچار بوو جارەكا دیتر پتریا مامۆستاییێن هاتینە دویركرن ڤەگەڕاندنە كوردستانێ، مەلا سلێمان ژ دەڤەرا (شرقات) بۆ دهۆكێ هاتە ڤەگۆهاستن و ل خواندنگەها (ئۆلا) ل دهۆكێ بو مامۆستا و هەتا سالا (١٩٧٠)ێ، ل وێرێ مابوو و پاشان زڤڕیەڤە زاخۆ و ل خواندنگەها (ئەحمەدێ خانی) بو مامۆستا، لێ پشتی سالا (١٩٧٤)ێ، پەیوەندیێن سەركردایەتیا كورد و ڕژێما عیراقێ ئالۆز و تێكچووی و شەڕی دەستپێكری، مەلا سلێمان ژ باژێڕێ زاخۆ دەركەڤت و چوو دەڤەرا ژێر دەستهەلاتداریا شۆڕەشێ و ل گوندێ (لێڤو) ل دەڤەرا سندیان جهواربوو. پشتی هەولەكا زێدە خواندنگەهەك ل (لێڤۆ) ڤەكر و ب هاریكاریا (مەلا موحەمەد مەلا سالح باوەردێ سلێڤانەی) ب ڕێڤەدبرن، لێ پشتی شۆڕەشا ئەیلولێ ژلایێ سیاسیڤە ل سالا (١٩٧٥)ێ ب داوی هاتی، جارەكا دیتر دزڤڕیتەڤە باژێڕێ زاخۆ، ل دویڤ بریارا حكوومەتا ئەوی سەردەمی یا عیراقێ كو هەر فەرمانبەركی مافێ ئەوێ چەندێ هەیە بزڤڕیتەڤە ل سەر ئەركێ خوە یێ بەرێ، لێ ئەو كەسێن پەیوەندێ ب شۆڕەشێ كرین، ڤرێكرنە دەڤەرێن دویری ناڤەندا باژێڕێ زاخۆ، مەلا سلێمان ژ ئەڤێ بریارێ ڕزگار نەبوو بەلكو بۆ گوندێ (دوورنەخ)ێ دناڤ سندیاندا هاتە ڤەگۆهاستن و بۆ ماوێ نێزیكی سێ سالان ل وێرێ مابوو و پاشان بۆ گوندێ (خیزاڤا) ل دەڤەرا گولیان هاتە هنارتن و هەتا سالا (١٩٨٠ز)ێ بۆ گوندێ (بەرزیرێ) دەڤەرا سندیان هاتە ڤەگۆهاستن، پشتی بوورینا سالەكێ بۆ خواندنگەها ئیسلامی دناڤ باژێرێ زاخۆدا هاتە ڤەگۆهاستن و هەتا خانەنشینكرنێ ل سالا (١٩٩٧)ێ، ل سەر ئەركێ خوە بەردەوام بوو.

سەرەڕای کارێ مامۆستایەتیێ وەك خوەبەخش د ڕێکا خودێ دا و ل هەر جهێ پێدڤی با ب ئەرکێ پێشنڤێژی و گۆتارخوینییێ ڕادبوو، ژبەر ئەوێ شەهرەزایا د بیاڤێ خواندنا تەجویدا قورئانا پیرۆز و پرسێن شەریعەتێ ئیسلامێدا هەی، دەرگەهێ مالا وی بەردەوام بۆ فێرخواز و زانستخوازان یێ ڤەکری بوو و هاتن و چوونا مالا ئەوی دکرن، ناڤبری کێماسی د گەهاندنا زانین و زانستێن شەرعی دا نەدکر. وەسا دیارە کو (مەلا سلێمان)ی هەر ژ دەستپێکا گەنجاتیا خوە هزرا ڤەهاندنا هەلبەستان هەبوویە و ئایین و نیشتیمان و پالدەرێ ڤەهاندنا هەلبەستان بوویە.

**چەند تیبینیێن گرنگ ل سەر دیوانێ:**

گرنگترین خال و تیبینیێن ئەڤێ دیوانێ ب ئەڤی شێوەیێ ل خوارێنە:

- پشکا ئێکێ یا دیوانێ ژ (٢٥) هەلبەستێن کوردی پێکهاتیە، کو د بیاڤێن ئایینی، سیاسی، نیشتیمانی دانە.

- پشکا دوویێ یا ئەڤێ دیوانێ گرێدایە ب هەلبەستێن عەرەبی کو ژ (١٢) هەلبەستێن ب هەر دوو جۆرێن ئایینی و نیشتیمانی پێکهاتیە. هەلبەستڤانی ب ڤەهاندنا هەلبەستێن نیشتیمانی ب زمانێ عەرەبی خواستیە هەستێ خوە یێ نەتەوایەتی بۆ عەرەبی زمانان دەرببڕیت. گرنگترین هەلبەستێن ئەوی یێن نەتەوەیی هۆزانا ب ناڤونیشانێ "معاناه الاکراد"ە. ژلایەکێ دیترڤە درێژترین هەلبەستا ئەڤێ دیوانێ ب زمانێ عەرەبی کو ل سەر سالوخەتێن پێغەمبەری (س) ل ژێر ناڤونیشانێ (بعض الشمائل المحمدیة علیه الصلاة السلام) ب شێوەیەکێ ڕێکوپێك هاتیە ڤەهاندن، کو ژ (١٢٠) کوپلەیان پێکهاتیە، هەر ئێك ژ ئەوان، تەوەرەکی ب خوەڤە دگریت ل دویماهیکا

هەر كوپلەيەكێ (يا حبيبي أنت الغالي) هاتيە دووبارەكرن. د ئێكەم مالكدا ئەڤێ هەلبەستێدا وەها دبێژيت:

أيـــا أهـــل الخيـــر صـــلوا
علـــى النبـــي لا تملـــوا
بصـــــــــفاته تحلـــــــــوا
يـــا حبيبـــي أنـــت الغـــالي

- ب هيچ رەنگەكى مە دەستكاريا رێنڤيسا هۆزانڤانى نەكريە، ب تنێ د ئەوان پەيڤاندا كو ب شاشيا رێنڤيسى دهێنە هژمارتن و كارتێكرنێ ل ريتم و واتايا هۆزانێ و چارچووڤێ گشتيێ ئەوێ ناكەت، راستڤەكرن هاتينە ئەنجامدان، بۆ نموونە: (چو- چوو)، (بو- بوو)، (بو- بۆ) و... هتد.

- هەول هاتيەدان هەر پەيڤەكا نە رۆهن يان پەيڤێن پێدڤى ب پێناسەكرنێ د ديوانێدا، ب شێوەيەكێ رێكوپێك ل پەراوێزان هاتينە نڤيسين.

- شێوازێ نڤيسينا ئەڤێ ديوانێ ب دەڤۆكا دەڤەرا (زاخۆ) هاتيە نڤيسين و هەر كەسێ ب هويرێ ئەڤێ ديوانێ بخوينيت ئەڤ چەندە دێ بۆ ئەوى ديار بيت.

- د ناڤ هەلبەستێن كورديدا هژمارەكا زێدە يا پەيڤ و مالكێن عەرەبى هاتينە بكارهينان بۆ نموونە: موطيع (گوهدار)، ظولْم (ستەم)، ئيعتيماد (پشت بەشتن)، مەشنەقە (دارێ سێدارەدانێ) و... هتد.

- هەلبەستڤانى هژمارەكا زێدەيا پەيڤێن زاراڤێ سۆرانى د ناڤ هەلبەستێن خودا بكارهينانە وەك: سەرۆكمان (سەرۆكێ مە)، رۆت (رۆيس)، بەزر (بەرزە، هندا)، گەورە (مەزن)، ئيش (كار، شۆل) و... هتد.

ـ هەلبەستڤانی د نڤیسینا خوە دا پیتێن عەرەبی تێکەلی پەیڤێن کوردی کرینە مینا: طارِی (تارِی)، طەمری (تەمری، ڤەمری)، طۆڤ (تۆڤ)، طام (تام) و... هتد.

ـ هەلبەستڤانی پتریا هەلبەستێن خوە ل باژێرێ (زاخۆ) د ناڤبەرا سالان (١٩٩٠) هەتا (٢٠٠٠) ڤەهاندینە.

ـ هندەك هەلبەستێن ئەڤێ دیوانێ بێ مێژوو و جهێ نڤیسینێنە و مە هەولدایە جهێ ئەوان ل دویماهیا دیوانێ بکەین، داکو تێکەلی هەلبەستێن دیتر نەبن و ل پەراوێزا هەر ئێك ژ ئەوان، هەڤۆکا (مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین) بکارهینایە.

ـ سەرۆك مەسعوود بارزانی د هەلبەستێن هەلبەستڤانیدا شێر، سەردار، سەرۆك، تاجا سەری، رۆناهیا چاڤان، پێشرەو... هتد بکارهینایینە. د چەند مالکێن هەلبەستان ل ژێر ناڤونیشانێ (سروودا بارزانی) ب ئەڤی شێوەیی دبێژیت:

بارزانی شێرێ کوردا     بارزانی ئەی بارزانی
سەرداری مێر و مەردا     بارزانی ئەی بارزانی
دەنگ دایە حەمی عەردا     سەرۆکێ مە بارزانی

ل هەلبەستەکا دیتر ل ژێر ناڤونیشانێ (سەرۆکاتیا بارزانی) ب ئەڤی شێوەیی باسێ سەرۆك مەسعوود بارزانی دکەت و دبێژیت:

کەیف و شانازی ئەڤرۆ یا مەیە
مەسعوود بارزانی سەرۆکێ مەیە
جەژنا پێشرەوێ حەمی کوردایە
ئەو نیشانا کوردینیا مەیە

ـ ژبەر ئەوێ ئەڤینییا هەلبەستڤانی بۆ کەرکووکێ هەی هەلبەست تایبەت ل سەر کەرکووکێ ب ناڤێ (کەرکووك) ڤەهاندیە و د چەند مالکاندا دبێژیت:

کوردستانا مە زەنگلە
باغە بۆ نێرگز و گولە
هەر لێ دخوینت بلبلە
کەرکووك نەبت ئەو بێ دلە

ـ مەلا سلێمان هەلبەستەکا ب ناڤێ (ئەنفال) تایبەت کریە ب ئەوێ ستەما ل مللەتێ کورد بگرە ژ کوشتن، تالانکرن و وێرانکرنێ و... هتد دکەت. د چەند مالکاندا دبێژیت:

گەلەك لاو و جەحێل و خورتێ کوردا
شەهیدبوون و ئەوانا پێ کرن جۆت
ل سەر دارێ قنارێ ئەو سویار بین
نەشیدا ئەی ڕەقیب وانا دگۆت

ل داوییا ئەڤی کاری سوپاسیا یەزدانی مەزن دکەین بۆ ئەوێ هێز و زانینا دایە مە، هەروەسا سوپاسیەکا تایبەت بۆ کوڕێ هەلبەستڤانی مامۆستا (ئازاد)ی کو هەر ژ دەستپێکا کاری هەتا ب داوی هاتنێ پشتەڤان و هاریکارێ مە بوو. هیڤیدارم ئەڤ کارە ببیتە جهێ مفا وەرگرتنا گشت خواندەڤانان.

د. فاخر حەسەن گولی

دهۆك ٢٠٢١

# ڕویڤی و مریشك[1]

ڕویڤی چوو نك مریشكێ
گۆتێ چەوانی خویشكێ

ژ مێژ تو نەی دیاری
بۆچی هندە نەیاری

مریشكێ گۆت نەساخم
هەردەم ب ئێش و ئاخم

ڕویڤی گۆتێ وە نینە
ڕابە سەری هلینە

ئەو ڕویڤیێ حیلەباز
ئەڤ مریشكا بەلەنگاز

ڕویڤی مریشك ژ ڕێ بر
قۆناغەكێ ب ڕێ بر

ئەو ڕویڤیێ ددان تیژ
مریشكێ كر قیژە قیژ

هندی مریشكێ كر هەوار
نەخێر ڕویڤی مریشك خوار

كەسێ تە دیت فێلبازە
گەلەك خوە ژێ ب پارێزە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ناڤەڕاستا سالان حەفتیان ژ سەدەیا بیستێ ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

## ئەزمانێ من[1]

ئەزێ رابم ناڕوینم
ئەزمانێ خوە دێ خوێنم

دا مللەتێ خوە ناسکم
وەلاتێ خوە ڕزگار کم

وەلاتێ من جوانە
ناڤێ وی کوردستانە

ئەزمانێ من شرینە
هەڤالەکێ ئەمینە

ئازاد کورەك جوانە
ئەزمانێ خوە بزانە

چونکی هندی ئەزمانە
بۆ "گەل" ناڤ و نیشانە



(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩١)ێ، ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

## سروودا بارزانی[1]

بارزانی[2] ئەی بارزانی     بارزانی ئەی بارزانی
بارزانی ئەی بارزانی     تو سەرۆکێ کوردانی
بارزانی ئەی بارزانی     تاجا سەرێ هەمیانی

بارزانی شێرێ کوردا     بارزانی ئەی بارزانی
سەرداری مێر و مەردا     بارزانی ئەی بارزانی
دەنگ دایە حەمی عەردا     سەرۆکێ مە بارزانی

بارزانی شۆڕەش ڕاکر     بارزانی ئەی بارزانی
مللەتێ کورد هشیارکر     بارزانی ئەی بارزانی
حکمێ زاتی داخوازکر     سەرۆکێ مە بارزانی

بارزانی بابێ مەیە     بارزانی ئەی بارزانی
ڕۆناهیا چاڤێ مەیە     بارزانی ئەی بارزانی
ناڤ و نیشانا مەیە     سەرۆکێ مە بارزانی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩١)ێ، ل باژێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) مەسعوود مستەفا بارزانی، سەرکرد و ڕێبەرێ گەلێ کورد، ڕۆلەکێ باش د هەر دوو شۆڕەشێن ئەیلول (١٩٦١-١٩٧٥)ێ، و گولانێ (١٩٧٦-١٩٨٨)ێ، دا هەبوو، د ناڤبەرا سالێن (٢٠٠٥-٢٠١٧)ێ بوو، سەرۆکێ هەرێما کوردستانێ بوو، نوکە وەك مەرجەعێ سیاسیێ کوردان دهێتە هژمارتن.

## گورگێ حەسوید[1]

ئەگەر مللەت هەزار بت
ئەگەر پەز بێ خودان بت
گورگێ حەسوید شڤان بت
گەلۆ حال دێ چەوا بت

ترسا پەزی شڤانە
ل حسابێ ئەو خودانە
ل دەستی گورزی گرانە
بێ دین و بێ ئیمانە

ژنك و بچویك وی كوشتن
لاو و جەحێل نەهشتن[2]
حەچی ڤێرە گەهشتن
پیر و مەزن مالشتن[3]

گوند و بازێڕ نەهێلان
كانییێت ئاڤێ ڤەكولان
خەلكێ دەشت و نوهالان[4]
حەمی بەردانە چۆلان

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩١)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] نەهێلان.

[3] ڕامالین.

[4] نهالان.

دار و دەڤـــــــی دەرمـــــــانکر
ڕەزێ تــــــری خرابکـــــــــر
جهـــــێ ئاڤـــــا وێرانکـــــــر
بچوێـــــك ژ دایـــێ جـــوداکر

دەمـــا خـــانی و گونـــد ســـۆتن
پاشــــی چ کــــرن و گـــــۆتن
زارۆك بـــــــرن فـــــــرۆتن
ئــــەزمــــانێ وان گۆهـــــۆڕتن

پاشـــی ژنـــك حـــەلالکــرن
بــێ مــەهــر بــو خــوە دروســتکرن
ب ســـاخی زەلام بـــن ئـــاخکرن
حـــەچکـــو دبێـــژی گـــاورن

یـــا وان کـــری کـــەس ناکـــت
کـــافر چـــو جـــا وە ناکـــت
کـــەس وەل شـــەعبـــێ[1] خـــوە ناکـــت
ڤـــان گونـــەهـــا کـــەس ناکـــت

هۆلاکـــۆ[2] و جـــەنگیزخـــانی[3]
حـــوکمێ نـــازی و ئـــەلمـــانی
فرعـــەونـــی[4] یـــو هامـــانی[5]
ئـــەڤـــە ب ســـەرێ کـــەس نـــانی

---

[1] گەل، مللەت.

[2] هۆلاکو خانێ مەغولی دناڤبەرا سالێن (١٢٥٦-١٢٦٥ز) خودان دەستهەلاتداری بوو.

[3] چەنگیزخان (تموچین) دامەزرێنەرێ ئیمپراتوریا مەغولیان (١١٦٥-١٢٢٧ز).

[4] فیرعەونێ مسرێ ئەوێ ل سەردەمێ مووسا پێغەمبەری (س).

[5] هامان وەزیرێ فیرعەونێ مسرێ ئەوێ ل سەردەمێ مووسا پێغەمبەری (س).

ئێڤاران و سحاران
دکین قێری و هەواران
گەلی دۆستان و یاران
بەرێ خوە بدن ڤان کاران

دۆست و هەڤال مە نینن
بەلەنگاز و مسکینن
نەفط[١] و پارە مە نینن
نەیارێت مە زەنگینن

ئەگەر مرۆڤ هەیی بت
بلا کورێ کەری بت
دنیا دێ ل پشت ئەوی بت
حەمی تشت دێ وەك وی بت



بۆ دەولەتا کرێتە
شەرمە و عەیبە و فهێتە
شەعبەك ئەڤە ب سەر بێتە
کەسەك ڕاستی نەبێتە

---

(١) نەفت، گاز.

## هۆزانڤان[١]

چ دیـــــوارێ ئـــــەز دبیـــــنم
چ کاغـــەزێـــت پێڤـــە دخـــوینم

بـــەحســێ هــۆزان و هۆزانڤانایـــە
ڕاســـت و دروســـتە هونـــەر بهایـــە

هـــۆزان تشـــــتەك زۆر جوانـــــە
ڕەوشـــا حـــــەمــــی مللـــــەتانـــە

بـــەلــێ کارێـــت گرنـــگ هـــەنـــە
ئـــەو ســـەبـــەبێـــت[٢] مانـــا مـــەنـــە

وەرن حـــەمـــی پێکـــڤـــە ڕوینـــین
هـــوین ڕێکـــەکـــێ بـــۆ مـــە ببینـــن

شـــەریکـــــەکـــــێ دامـــــەزرینـــــن
ئـــەرزاقـــی هـــوین بـــۆ مـــە بینـــن

مللـــەت مـــوعیزە[٣] و برســـی یـــە
پێخـــواس و ڕویـــس و گـــازی یـــە

تشـــتێ گـــەلـــەك گرنـــگ نانـــە
ســـەرکـــــەفتنـــا مللـــــەتانـــــە

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩١)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] هوکار، ئەگەر.

[٣] هەژار و بەلەنگاز.

مه ديت ڕوسيا چەند ل كار بی
سەبەب چ بی ئەو منهار[١] بی

نەكو چك و سيلەح نەبی
نە ژبەر هندێ لەشكەر نەبی

ئابووريا وان لاواز بی
لەو دەولەتا وان منهار بی

وەيە صارۆخ تێر حنرە
بەلێ نان ژێ ب حوكم ترە



---

[١] ژناڤچوون.

## ئەنفال[١]

گەلەك رێكەك درێژ دوێر مە ئاژۆت
نەیارێ مە حەمی ل گەل مە كر و گۆت
حەچی تشتێ مە هەی پێكڤە حەمی چوو
ڕەز و بیستان و خانی دوژمنی سۆت
جل و ئامان و تەڤ تشت وان هلانین
حەتا دانهێرك و ساڤار و حەمی قۆت
چو دەخل و دان و نیسك و نوك نەهێلان
نە عەرد و نە زەڤی و شوڤ و نە جۆت
پەز و حێوان و تەرشێ مە ب هەزاران
كرن ئەنفال و بر مووصل فرۆت
گەلەك لاو و جەحێل و خورتێ كوردا
شەهیدبوون و ئەوانا پێ كرن جۆت
ل سەر دارێ قنارێ ئەو سویار بین
نەشیدا[٢] ئەی ڕەقیب وانا دگۆت
د حەبسادە[٣] مرن لاو و ژن و كال
ستووێ كوردا وەریسێ مەشنەقێ[٤] كۆت

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٢)ێ، ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] سرۆد.

[٣] زیندان، گرتیخانە.

[٤] سێدارەدان.

کـــرن ئـــەنفـــال ژن و زارۆکـــێ کـــوردا
کچێت جان چوون حەتا بەسرا و کۆت[(١)]
حـــەچـــی کـــوردێ دبینـــین دلبرینـــە
نەما کەس لێ نەکەت یەك سەر بزۆت
ل بەر چاڤێ مەیە شارێ حەلەبچە
چـــەوا دەرمـــان ڕەشـــاند و چـــەوا ســـۆت
ڕۆح جـــان گیـــان و مـــال و دەولـــەت
نەمان، ئەم ماینە پێخواس و سەر قۆت
بـــلا بـــەس بـــت ڕەڤـــین و دەربـــەدەر بـــین
حەتا کەنگی دێ مینین برسی و ڕۆت[(٢)]
ئـەوا ب چـاڤێ خـوە دیتـی مللـەتـێ کـورد
بـــلا بـــەیهـــودە[(٣)] و ژ قـــەســـتا نـــە ڕۆت
دخـــوازین ئـــەم ژ لاو و خـــورتێ کـــوردا
ڤـێ جـارێ ل پـێش نـەیـارێ بـن بـزۆت
وە چێکر بەرلەمان و دولەتا کورد[(٤)]
نەبەردن گوهـ نەدن کا کێ چ گۆت
حەمی ئێك بن حەمی پێك بن دەڤ و دل
دا داعـوێرن نـەیـارێ خـوە وەکـی حـۆت
سەرۆکێت مە بژین سەربەست و ئازا
یـــولی الظلـــم و القهـــر یمـــوت[(٥)]

---

(١) باکوورێ عیراقێ.

(٢) ڕویس.

(٣) بێ مفا، بێ قازانج.

(٤) ل جهەکێ دیتر: وە پیرۆز بت خەلاتێ حوکمێ زاتی.

(٥) واته(ستەم بچیت و نەخوەشی بمریت).

## ماموٚستا[٢١]

ماموٚستا زێڕە و بهاگرانە
یاقوت و ئەلماس ل بەر ئەرزانە

چرای کوردستان سەیدای بەرێزە
مللەت ب وی زانا و بهێزە

حەمی ئەفسەر و زانا و وەزیر
سەروٚك و پزیشك حەکیم و خەبیر[٣]

ئەو بینە زانا و فێربین قەلەم
ژێردەستێ سەیدای بە ڕەحم و کەرەم

ل جڤاتا دبێژن تو گوهـ لێ دبێ
موعەلم نە دویرە ببیتن نەبێ

بەلێ ژ دەرڤە بیرا کەس نائێت
ماموٚستای گران بها پێ نائێت

شوٚلا خوارن بت سەیدا نە ل بیرە
ل بیرا کەس نینە چونکی فەقیرە

هەر ئێك دبێژت ئەزم زانامە
ڕێبەر هەر ئەزم ئەز شارەزامە



---

١

[٢] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٢)ێ، ل باژێڕێ (زاخوٚ) هاتیە ڤەهاندن.

[٣] شەهرەزا.

نـــزانن ســـــەيـــدا دارا زەيتينـــــە
هـەردەم سـيبەرە و هـەر وەختـى شـينە

زانـين و فێـربين بـدەسـت سـەيدايـە
شـــەوق و ڕۆنـــاهى ژ فنـــد و چرايـــە

شـەمالـك د سـۆژت ڕۆنـاك بـەلاڤـە
ل بـــەر ڕۆنـــاكى دكـــين بزاڤـــە

زارۆك بچويكـــە شـــەيتـــان و هـــارە
سـەيـداى ل گـەل وى قێـرى و هـەوارە

ژ مـــال دێ ئێـــتن كـــورە و نـــەزانـــە
ســـەيـــدا دێ وەرە فێركـــە زمانـــە

بـارێ سـەيـداى گـەلـەك گرانـە
نـە ڕاتـب باشـە و نـە تشـت ئـەرزانـە

خـودێ ل سـەيـدايى بكـت ڕەحمـەتـێ
ئـەو لـێ سـڤك كـت بـارێ زەحمـەتـێ

يـێ دل كۆڤـان و كـەسـەر سـەيدايـە
بـــارێ گـــران ژى خـــەمـــا خودايـــە

## معاشێ سەیدای[1]

هەیڤا معاشی ئەوە سەر ڕۆژن
بەلێ ڤێ گاڤێ چل و پێنج ڕۆژن

شەڤێت مە تێن و ڕۆژێت مە دبوورن
مامۆستا پێکڤە ڕۆژا دهژمێرن

بو ئێك دبێژن شۆلا تە باشە
مزگینی بۆ تە سوبە معاشە

معاش مە وەرگرت دینارێت پەحنن
نیڤەك دڕهاینە و نیڤا دی کەڤنن

هندی دگەم کەس نا وەرگرت
قەسابی نەڤێن بەقال ناگرت

دکان دکان تێم دیسا دزڤرم
نزانم پێ چی ساڤاری بکڕم

پارە دڕهاینە و چ دی مە نینە
پرس و پسیار ل حالێ مە نینە

ڕۆژا دی دیسا ئەز هاتم سویکێ
هەر ئەو پارەنە د ناڤ بەرویکێ

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٢/٨/١٠)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

ئـــەز چـــووم و هـــاتم دیسـا وەك دیسـا
مووســـای نـــە ڤیـــان و نـــە گـــرتن عیسـا

چـــبكم چ بێـــژم بێـــژم هــــەوارە
ئـــەڤــە گلێشـــە نـــابێژنێ پـــارە

كـا بێــژن چ بكـــین گـــەلـی هــەڤـالا
گـــەلــــی مامۆســــتا كۆمـــا دەلالا

دێ ڕابـــن هـــەڕن بـــەرەی كوردســـتان
ڤـــی تشـــتی بێـــژن دیـــار كـــن بـــۆ وان

بێـــژن ئـــەی بـــەرە چ ل ڤـــان پـــەرا بكـــین
ل نـك مـە خـەرج نـابن كـا ئـەم چ لـێ بكـین

هنـــدێ دینـــارێ پـــەحـــن[1] و دڕهایـــە[2]
كـــەســـێ نـــەڤێـــتن بـــۆ مامۆســـتایە

دیـــارە ســـەیـــدا گـــەلـــەك لاوازە
لـــەومـــا بـــێ دەنـــگ و بـــەنـــگ و ئـاوازە

مـــادەم وەهایـــە ئـــەم دێ بـــەتـــال كـــین
گـــازێ فرۆشـــین خـــوە پـــێ خـــودان كـــین

---

(١) پان.
(٢) دڕیایە.

## کەلەپۆرێ کوردی[1]

تو چەند خوەشی کەلەپۆر
گولا گەشی کەلەپۆر
زۆر بێهن خوەشی کەلەپۆر
وەرن بێهن کن کەلەپۆر

کەلەپۆرێ مە کوردا
نیشانە بۆ مە مەردا
گەلی باژێر و گوندا
گوهێ خوە بدن کەلەپۆر

چەند گۆتن و چیرۆکا
سەرهاتی و مەتەلۆکا
هۆزان و هەم دیرۆکا
حەمیا دبێژت کەلەپۆر

ل حەمی کوچك و جڤاتا
ل حەمی جهـ و وەلاتا
ل حەمی کەیف و داواتا
یێ پیرۆزە کەلەپۆر

سوپاس بۆ تە کەلەپۆر
سوپاس بۆ تە گولا سۆر
دەستکێت گولا بدن دۆر
هەر تو بژی کەلەپۆر

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٢)ێ، ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

بــــەســــە هنـــدە درێـــژ كـــين
ســـەرێ هـــەڤـــالا گێـــژ كـــين
وەرن حـــەمـــى دێ بـــێش كـــين
دا ســـەركـــەڤـــت كـــەلـــەپـــۆر

## مه شۆڕەشكر[1]

مه شۆڕەشكر مه شۆڕەشكر
چرایێ كوردا مه گەشكر
پێشمەرگەنه شێرێت چیا
كوردستانا مه پاقشكر[2]
خەباتكرن كورێت كاوەى
رویێ دوژمن ئەوان ڕەش كر
شەرێ شێرا ل گەل ڕیڤیا
جهێ كوردا گەلەك خوەشكر
گەلەك هزرەك مەزن مه دكر
دەما پێشمەرگەى شۆڕەش دكر
چ بێژین ئەم ژ خەلكێ را
گەلەك گازندە پێشكەشكر
گەلەك تشت تێن كرن بەر چاڤ
مه نه ژبەر وانا شۆڕەش كر
گەلەك ئەرزاق و تشت تێتن
ل سەر زەنگینا دابەشكر
خانی و قەسر بلند كرن
پێ مەمەرێ سپی و ڕەشكر

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێكخستنا (هەیڤا ١ ساڵا ١٩٩٣)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] پاقژ.

فـــەقيــــرێ ب شـــۆڕەشــــێ ڕابـــى

تـــژى بـــەر كـــا و كـــەربـــەشـــكر[1]

ئـــــەوێ ڕۆح داى و مــــــال ســــۆتى

ژ حـــەمـــى تشـــتا وە بـــێ بـــەش كـــر

ئـــەڤـــى شـــكلى ئـــەڤـــى ڕەنگـــى

دلــــێ مــــە ژ شـــۆڕەشــــێ ڕەشــــكر

حـــــەجـــــى..... [2] نـــــە پێتڤـــى بـــى

بـــۆ ئـــەرزاقـــى خـــوە دەڤ بـــەشـــكر

گـــەلـــەگ ديـــژى وەكـــى وى چـــوون

خــــوە ڕســــوا و هنــــاڤ ڕەشــــكر

خودانێـــت مـــــەخـــزەنێـــت جلكــــا

بـــەزيـــن و خـــوە ل بـــەر خـــوەش كـــر

بــــــرنج و دوهــــــن و ئــــــار ئينـــــان

بـــۆ مالێـــت خـــوە ئـــەوان كێشـــكر

بـــلا ئـــەڤ ئـــێش و كـــار بـــەس بـــن

لـــەش و چـــەرمـــێ مـــە وە گشـــكر

---

[1] جۆرەكێ گيايە ل وەزرى بهارێ شوين دبيت.

[2] ناڤ هاتيە پاراستن.

# پێشمەرگێت بچویك[1]

ئەم زارۆكێن وەلاتن
پێشمەرگەیێن خەباتن

گیانێ مە قوربانە
فیدایێ كوردستانە

وەلاتێ مە شرینە
ئاخا وەلات زێڕینە

ئاڤ زۆرە ل ناڤ وەلاتی
ل گەل گازا ڤەشارتی

سێڤ و خوخ و هنارا
گویز و تری و خیارا

وەلاتێ مە زەنگینە
خودا بۆ مە ب حەوینە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێككەڤتی (هەیڤا ٢ سالا ١٩٩٣)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

## چوونا گوندا[١]

گەلی کوردا هەرن گوندا
هەرن شینکن زەڤی و عەردا

بچینن باغ و بیستانا
بۆ هاڤین و زڤستانا

گەلەك گەنم و جەهی بچینن
دا هوین پارا پێ بستینن

برنج و كونجی و نیسكا
چ ماش و گارس[٢] و نوكا

هنار و مژمژ و سێڤا
بخون هەردەم ب دەڤ و لێڤا

خودانكن هوێن پەز و چێلا
بچەرینن ناڤ دەڤی و شێلا

دا هەر هەبت ژاژی و پەنیر
دا زۆر ببت مە ماست و شیر

شولێ گوندا خەزینەیە
خودان ملك تێر پارەیە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل رێككەڤتی (هەیڤا ٤ سالا ١٩٩٣)ێ، ل بازێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) گارس، بهارەك زوی د چینن و ئاڤیە و تێر بەرهەمە، گولیا ئەوێ مەزن و گومجە، ب مەبەستا كو زوی هشك ببیت، گولیێن ئەوێ د داننە بەر حەتاڤێ، ژبۆ نانی دهێتە بكارهینان.

چوونا گوندا گەلەك فەرە
خوە لێك بدە ڕابە هەرە

دڤێت گوندێت خوە ئاڤا كین
ئەم شۆل بكین خوە خودان كین

چەم و زەڤیا حەما بكێلین
پێنگاڤەكێ ژێ نەهێلین

گەر چیایە ئەگەر دەشتە
گوندێ تە بۆ تە بەحەشتە

تو دەركەڤە ژ باژێری
هەڕە گوندی تو جامێری

دێ میرەكی ب دەستێت خوە بی
سەر فەراز و سەر بخوە بی

سپێدێ هەڕە ناڤ ئاڤاری
پشتڕاست وەرەڤە ئێڤاری

تە هەست نابت ب وەستانێ
ژبەر خوەشیا كوردستانێ

كوردستانا مە ڕەنگینە
وەلاتەكێ پڕ شرینە

دڤێتن ئەم ڕابین سەرخوە
هەر دوو پێت خوە بدین بەرخوە

زەند و باسكێت خوە هلكێشین
نابت بێژین ئەم پشت ئێشین

هەر باوەری مە ب خوە هەبت
ئیعتیمادا[١] مە ل سەر مە بت

---

(١) پشت بەستن.

دا ئەم بژین ساڵ و زەمان
پشتڕاست ببین ل کوردستان

گەر خانی یێ خوە چێنەکی
جهۆ وارێ خوە خوەش نەکی

ساڕ و گەرمێ ڕوێنی ژوورە
خەلکێ غەریب نە مەجبوورە

حەتا کەنگی دێ چاڤ زل بین
دەست بیانیا دێ گوهـ بەل بین

نابت هەڕۆ هەر بیانی
بۆ مە بینن ئار و دانی

ڕۆژەك دێ ئێت دێ بەتال کن
دەستێ خوە دێ ژ سەرمە ڕاکن

دڤێت بشێین خوە ڕاگرین
شەرمە ئەم ژ برسا بگرین

دڤێت شۆل کین دا ئەم بژین
ڕزگار ببین ژ دەست خوینمژین

جووت و کێلا زەحف و زۆر کین
ژینا کوردا مسوگەر کین

تشتێ گەلەك گرنگ نانە
ژین و مانا مە حەمیانە

گەر ئەم نەکن نەخەبتن
دان و دکاك مە نابتن

هوین ل خەلکێ باش بنێرن
ئەو ژی وەك مە ژن و مێرن

بەلێ ب شەڤ و ڕۆژ ل کارن
پەیا نابن هەر سویارن

شۆل و کارا بەتال ناکن
چو جا بێهنا خوە ڤەناکن

ڕۆژا مە دگۆت ئەڤە دەرکەت
ئەڤە فرسەت بۆ مە هلکەت

پێویستە ئەم ڤێ دەرفەتێ
ژ دەست خوە نەکین ڤێ هلمەتێ

پاشی شەرمە بۆ مە کوردا
ڕەزیل ببین بکەڤین عەردا

کەیفا نەیاری دێ بمە ئێت
قەبحەت گرانە ب سەر مە دێت

چاڤا ڤەکن دویر بنێرن
هوین بۆ حەمی تشتی فێرن

ئەم دزانین ئەم هشیارین
بەلێ توزێک[1] نە گوهدارین

کەسێ هەر چاڤ ل دەستا بت
باشە ل ناڤ گورستان بت

---

(١) پیچەکێ.

## فەقیری[1]

سحارێ دێ فەقیر ڕابت
حەمی دنیا ل بەر تەنگە
دێ ئێت و چت چو نابینت
بچویکا ل گەل شەڕ و جەنگە
مەدام دێ بێت چ لێنم ئەز
هەڕە سویکێ نێ درەنگە
فەقیر چ بکت چو نینە ل دەست
دبینی لێ نەما ڕەنگە
ژ خانی دەرکەت ژ دەرڤە
چ سەر شووڕە چ دل تەنگە
نەشێتن ڕێڤە خوەش بێتن
وەکی تێتن دبێی لەنگە
گەهشت سویکێ بەریک ڤالە
ژ قەهرا ژێ نائێت دەنگە
فەقیری چەند نە خوەش حالە
حەمی ژان و کول و ژەنگە
برایێ دەولەمەند و تێر
ل نک وی دەرهەمەک گەلکە
خەم و دەرد و خیالا وی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (هەیڤا ٤ سالا ١٩٩٣)ێ، ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

ئـــــەوە پـــــارا بكــــت لنگـــــە

تـــەليســـا دێ تـــژی كـــت ئـــەو

ل ســـەر يـــەك دێ كـــتن دنگـــە

فـــــەقيـــــرێ برســــــى و تـــــازی

مـــرادا وی كـــەفـــەك بـــەلگـــە

## خودایێ مێهرەبان[1]

خـــــودایێ بلنــــــد و ئـــــەوێ مێهـــــرەبـــــان
دیارییـــــەك مـــــەزن دامـــــە گـــــەورە[2] و جـــوان

ئـــــەوی بـــــۆ مـــــە تـــــازە رێـــــا رۆن کـــــری
ب هنارتنـــا رەســـوولێ عـــەزیـــز و پێغـــەمبـــەری

جیهـــــان ژی تـــــژی بـــــی ژ ظـــــولم و کوفـــــار
ئـــــەوێ کـــــو بـــــەهێزیـــــا بـــــەلنگـــــاز دخـــــوار

مرۆڤـــــا ژیـــــەرا رە عیبـــــادەت دکـــــر
ئـــــەوا پێکڤـــــە هیڤیـــــا وا بـــــاوەر دکـــــر

عـــەدەت بـــی کـــچ ب ســـاخی بـــن ئـــاخ دکـــرن
چ شـــۆلا خـــراب و گونـــەهبـــار دکـــرن

ژیـــان و ئـــیش[3] و کـــەســـپ و کـــارێ وانـــا
شـــەلانـــدن بـــی و ئینانـــا تـــەرش و تالانـــا

زەلامـــێ زیـــرەك و چـــالاك و مێرخـــاس
ئـــەوە یـــێ کـــو پـتـــر خـــەلکـــی بکوژت یـــا نـــاس

موحـــەمـــەد هـــات رژێمـــا وان گوهـــۆری
بـــەرێ خـــوە بـــدێ بوســـلمان تـــو نـــە کـــۆری

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل رێککەڤتی (١٩٩٣/٨/٣٠)ێ، ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] مەزن.

[3] شۆل، کار.

حەمی پەردە ل سەر چاڤا هلانی
مرۆڤ ژ طارپێ[1] تازە دەرانی

ل مە جیهان ئەوی ڕۆن و ڕەوان کر
حەچی تشتێ نەباش هەی وی خرابکر

ظولم ڕابی و تەناهی هاتە شوینێ
بوسلمانا جیهاد کر ب مال و خوینێ

گەلی پیرا گەلی خورت و جەحێلا
موحەمەد چوو چو مال پشت خوە نەهێلا

ژبلی ئەخلاق و عیلم و عەدل و عرفان
حەدیثە سونەت و دستووره قورئان

چو قەسر و قەیسەری و ئوتێل نە هێلان
چو شوڤ و طۆڤ[2] و زەڤی و عەرد وی نە کێلان

بوسلمانێت بەرێ ئەوبین بوسلمان
ژ بۆ دینی ددان مال و ڕۆح و جان

کەدا وانا جیهادا کافرا بی
مرادا وانا ڕزا بینا خودا بی

ئەوان دنیا حەمی گرت و ڤەگرتن
ژبەر هندێ چکی بۆ دینی خورتن

ملووك و شارەزا بۆ وان موطیع[3] بین
خودان عەهد و ئەمان و عەدل و دین بین

---

[1] تاری.

[2] توف.

[3] گوهدار.

مخـــابن ئـــەم ب وانـــا بێینـــە نـــاڤ دان
وەکـــی وانـــا ژ مـــەڕە بێـــژن بوســـلمان

نـــە مـــە دینـــە نـــە ئـــەخلاقـــە نـــە ئیمـــان
دبێـــژن مـــە بوســـلمان بـــەس ب ئـــەزمـــان

حـــەســـویدین ظـــالمین پێکڤـــە درەویـــن
بـەخیلـین ئـەم حـەمـی بێ بـەخـت و بێ دیـن

فـــەقیـــر بمـــرت کـــەســـەك نابێـــت چ حالـــە
ل بـــەلنگـــازی نـــە پســـیارە و ســـوئالە

حـــەچـــی دبینـــی چ مـــەســـئوول و چ ڕێبـــەر
ســـەرۆك و کاربـــەدەســـتێت مـــە ســـەرانســـەر

نـــە پســـیارە و نـــە هـــیچ تشـــت تێتـــە گـــۆتن
لـــەوا زۆر کـــەس دحـــالێ خـــۆ دە ســـۆتن

نـــەهوســـانە ژیـــان و کاربـــەدەســـتی
ئـەوێ ب شـۆل کـەت و کـارەك هاتـە دەسـتی

وی بیـــر نینـــە ل بـــرا و دۆســـت و هـــەڤـــالا
نزانـت کـو هـەڤـال بـین پێکڤـە چـەنـد سـالا

هـەر ئێـك دبێـت ئـەزم کـەس نینـە هـەر ئـەز
ئـەزم لـەشـکەر ئـەزم شـەڕکـەر ئـەزم هـەر ئـەز

دکـــین گـــازی و دخـــوازین ئـــەم ژ خـــودایی
حـــەمـــی پێکڤـــە ببـــێن ئـــامین ب تـــەبـــایی

ســـەرۆك و کاربـــەدەســـت و هـــەر کـــەس ژمـــە
بـــزانین یـــا فـــەر و واجـــب ل ســـەر مـــە

حەمی ل گەل ئێك بن و تەڤ ببنە یەك دەست
کـو بیـر و بـاوەری ب شـۆلا بکـین هـەسـت

بـــو خێـــرا مللـــەتـــی و دینـــی بکـــین کـــار
خــــودا: تـــــو مــــــە بپـــــارێزە ژ گرفتـــــار

مـە ئاهـەنگـە بـە بیناتـە حـەبیبـێ مـە[1] ڕەسـوول
ئیلاهـی هـەردەم و گاڤـا ژ مـە تـو بکـی قـەبوول

---

[1] خوەشتڤی.

## مە ساڤار کر[1]

کوتەك مە هندەك گەنم پەیداکر
شویشت و پاقژ کر بێژینگ کر و بەرباکر

چلی هاڤینێ مە ل مال ساڤارکر
نەقلا دووێ بی و بارانێ لێکر

باران وەسا هات وەك یا بهارا
شوورکێت سەربانا چوون وەك جوبارا

ئاگر طەمڕی[2] و ساڤار ئاڤێ بر
یێ مای پەرچقی و ژنکا پێ لێکر

کەهرەب قەطعە[3] بی و دنیا ژی شەڤە
فانوس هلنابن چنکی بادەڤە

سەر ڤێ حەمێ ڕە مێهڤان ژی هاتن
گەلی مێهڤانا وەرن ب خێر هاتن

مێهڤان ڕاببین چوون بی طاڕی[4]
ئەم پێگڤە ڕاببین دورا ساڤاری

هەڕە سەربانی گەرا ئاڤێ یە
دورا مەنجەلێ نیڤا شەڤێ یە

---

(1) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢/٨/١٩٩٣)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

(2) تەمری، ڤەمری.

(3) قەت، هاتە بڕین.

(4) تاڕی.

پشتی زەحمەتێ هندەك مە ڕاكر
مە شویشت و لێكدا و هشك و زۆها كر

ساڤار بژارتن پشتی وێ پاشی
ڕابینە سەر خوە ئەم چووینە ئاشی

ڕۆژ هاتە نیرو ئاش بی دورا مە
خوەزی تە دیتبا كار و بارا مە

ڤیجا ئەم ڕابین ساڤار مە شل كر[(١)]
مە ب سەر ئێخست و كودەل[(٢)] مە پڕ كر

هندەك هات خوارێ و قایش ڤەڕەست
ئەڤە چ چێبی گۆت ئاش شكەست

ساڤار ما تێدە و دنیا ژی گەرمە
ترسم ترش ببت نمهای و نەرمە

ساڤار مە ڕاكر جارەك دی دیسا
حەمی مە كۆمكر مە كر تەلیسا

ئەم چوون ئاشەك دی ئەو ژی خراب بی
ئەم چوون ئێكە دی كەس لێ نەما بی

دنیا بی ئێڤار ئەم هاتن مالێ
وەستای و دل تەنگ وەی ڤێ ئێغبالێ[(٣)]

تەلیس هلگرتن برن سەر بانی
ساڤارێ مە بی گرارا گاڤانی

---

(١) تەڕ.

(٢) كودەلا ئاشی.

(٣) ئیقبال، شانس.

سحارێ دیسا ئامان پڕ کرن
جارەك دی قەستا وی ئاشی کرن

حەتا ئەم چووبین ئاشێ مە گێڕا
باشبی ڤێ جارێ ساڤار مە هێرا

شۆلا فەقیری هەر دەم ئالۆزە
دیسکا[1] فەقیری هەر قون قولۆزە[2]

مرۆڤ نزانت بۆچی وەسایە
ئیشێ فەقیری قەهر و بەلایە

حاشا ئەم بێژین خودێ نەیارە
بەلکی ل گەل وی ئەو دوست و یارە

خودێ وا وەسا بۆ وی حەسکری
دا پاشەڕۆژێ وی نەبت ئاگری

خودا: مەزنێ خودان کریاری
بارانێ نەدە ڕۆژا ساڤاری

---

(١) قازانك.

(٢) بێ سەروبەر.

## مخابن[1]

مخابن بۆ ئەڤان کوردا
بەلاڤ بینە ل حەمی عەردا
فەقیر و ڕویس و برسی مان
نەساخن ژبەر کول و دەردا
حەمی بێ غاز و بێ گازن
نە دەرمان بوو دبن پەیدا
گەلەك وەستان فەقیر و ژار
گیان و مال حەمی ب دەردا
چ شۆلێ زەحمەت و ئیزا
ل سەر پاتکا هەژاران دا
شەهیدا بۆ مە ڕێ ڕۆن کر
خوینا وان کر چرا و فندا
ژبەر کورد و کوردستانێ
ڕۆح و جان وان کرن فیدا
بەلنگاز و هەژارا کر
زك ستویرا خوە ل سەر دا
فەقیرا چاند و مەزنا خوار
ئەوان پارە کرن فەردا
دوکان و قەیسەری و ئوتێل
ئەڤە بینە حەقێ کوردا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (۱۹۹۳)ێ، ل باژێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

حەما ل بیرە حەفتێ و چارێ[1]
ئوتێل هێلان د قالب دا

بە سەتل و تانك و بەڕمیلا
خوینا ڕشتی د بەرچی دا

سەرۆك و ڕێبەرێت زاخۆ
کرن صەبغ و ل دیواری دا

موخەڕب دێ خرابیا کت
دێ هند بینی ئەوان بەردا

گەل و ئەڤ دێ چەوا بت حال
نەما ئاقل نەما سەودا

نەپرسە ل مە بەلنگازا
نەترسە ژ خالقێ عەبدا

گەلی بەرپرس و جامێرا
بپارێزن حەقێ کوردا

حەتا ڕۆژا قیامەت بێت
ئەمێ[2] مینن د ڤی دەردی دا

نەحەوجە هندە ئەز بێژم
شەرەف شێرە د بیشی دا

---

(1) ١٩٧٤ێ، پشتی دووبارە شۆڕەشا ئەیلولێ سەهلدایەڤە.

(2) ئەم دێ.

## نەورۆزا سالا ١٩٩٣[١]

بهار هات ل کوردستانێ
خەلك دەرکەتن چوون سەیرانێ

کەسك و سۆر و شین و زەرا
دیلان کرن ل حەمی دەرا

عەرد ب خەملا خوە خەملی
ل خوە کر کراسەك گول گولی

گوهدێرە دەنگێ بلبلا
بنێرە ڕەنگێ سۆرگولا

نێرگز ل لاتا گرنژین
لیلۆز ل پالا[٢] بێهنژین

دار بشکفتن خەملا خوە دان
ل ناڤ گولا بی سەرهلدان

هەر ئێك دبێت ئەز بلەزم
ڕەوشا بهارێ هەر ئەزم

مێرگ و چیمەن سۆر و زەر بین
ئاڤ و دەراڤ حەمی دەر بین

---

[١] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٣)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[٢] پەتەن.

بـی قـەب قـەبـا کـەوی ل چیـای
سـەیـران خـوەشــن ل نـاڤ گـیـای

نـــەورۆز وەرە ئـــەڤـــرو ببـــین
ئەڤ ساڵە ئەم زور کەیف خوەشین

چاڤێــت خــوە کــوردا بــەقکــرن
رێزگـرتـنـــا خـــوە چێکـــرن

مـــەزن و ســـەرۆك هلبـــژارتن
حوکمــەت بــۆ مــە دامــەزرانــدن

ئیسـاڵ گـەلـەك نـەورۆز خـوەشـە
هـەر چـەنـد رەخـا ئـاگر گـەشـە

نـەورۆز گولـەك گـەش و جوانـە
یـا ب حوکمـەت و بـەرلـەمانـە

مزگینـــی بـــۆ کـــوردێن دەلال
سـەرۆك مـەسعوود و مـام جـەلال

خـــەبـــاتکرن ســـاڵ و زەمـــان
دوژمـــن ل نـــاڤ وەلات نـــەمـــان

کـوردێ مـە وان سـەربـەسـت کـرن
ســـەرێ مـــە وان بلنـــد کـــرن

بـــژین شـــەهیـــد رزگـــار کـــرین
ژ دەســـت دوژمنـــی قورتـــال کـــرین

هـــەردەم بـــژیتن ســـەربـــەســـتی
بـــلا بمـــریتن ژێـــر دەســـــتی

سـلاڤ بـۆ وە گـەلـى كـوردا
هـەر سـەركـەڤـن ل حـەمـى عـەردا

بژيـــت وەلات بژيـــت نـــەورۆز
هـەر بـۆ مـە بـێن جـەژنێـت پيـرۆز

## فیدایی بۆ وەڵاتی[(١)]

ئـەگـەر بمـرم ل سـەر ئاخـا وەڵاتـی
ئـەگـەر بـێم شویشـتنێ ب ئاڤا وەڵاتـی

ڤـەشـارتی بـم ل بـن ئاخـا وەڵاتـی
بـبم قوربـان ئازادیـا وەڵاتـی

ب حـەلهـم ئـەز ل نـاڤ ئاخـا وەڵاتـی
ڤـەنـابم نـاڤ بـەر و ئاخـا وەڵاتـی

گیـا بـم شـین ببم ئـەز نـاڤ وەڵاتـی
گولـەك بـم دەرکـەڤم سـەر ڤی وەڵاتـی

بچویکـەك بێـت ژ زارۆکـێن وەلاتـی
ب قرچینـت گـولا تـازە هـەلاتـی

حـەمی بێن کن، کچ و لاوێن وەلاتی
ئـەڤـە بـەسـە فیـدایی بـۆ وەلاتـی

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ساڵا (١٩٩٣)ێ، ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

## بەبوونەی چوونا پێغەمبەری بۆ عەسمانی[1]

گەلی دۆست و هەڤالا
برا و مام و خالا
بەری هزار و چار سەد سالا
موحەمەد چوو بوو عەسمانی

خودێ عەبدێ خوە شەڤ ڕێکر
ژ مەکێ قەستا قودسێ کر
گەهشت وێرێ نڤێژ لێ کر
دێ بت مێهڤانێ یەزدانی

چ مێهڤانەك خودان قەدرە
خودان ڕەحم و خودان صەبرە
ئەو و جبریل چوون ب هەڤرە
گەهشت بن عەرشێ ڕەحمانی

چ نۆڕەك دیت نەزەر لێ کر
خودێ دیت و سلاڤ لێ کر
خودێ ب خێرهاتنەك لێ کر
بە خێر هاتی تو مێهڤانی

خودێ دەست ڤالە نەڤرێ کر
خەلاتەك زۆر مەزن لێ کر
نڤێژ دایێ و ئەمر لێ کر
ببت سجدە بو ڕەبانی

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا (١٩٩٤)ێ، ل باژێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

گەلەگ كەس ب ڕێڤە وی دینە
ژ هەڤالێ خوە د پرسینە
ئەرێ جبریل ئەڤە كینە
دبینم ئەز ل ڤی بانی

دیار كر ژێرە گۆت دیسا
یەك ئیبراهیمە یەك عیسا
ئەڤە هارۆنە ئەو مووسا
حەمی كۆ من ل عەسمانی

ڤەگەڕیاڤە و هات خوارێ
بۆڕاقێ[١] ڕاكر یەك جارێ
گەهاند مالێ ل گەل سحارێ
ئەڤە موعجیزە یە ئانی

ئەوا پێ چووی نە سارۆخ بی
موحەمەد ژی نە طەیار[٢] بی
بەلێ ئەمرەك موقەدەر[٣] بی
خودایی ئەو برو ئانی

دكین هیڤی و ڕجا یاڕەب
دكین گازی ل تە یاڕەب
تو ڕەحما خوە ل مە كە یاڕەب
تو غەفاری[٤] تو ڕەحمانی

---

[١] ئەو دەوار بوو ئەوێ پێغەمبەر (س) لێ سووار بووی و چوویە ئەسمانان.

[٢] فرۆكەڤان.

[٣] بەلێ ئەو بوو ئەوا حەسكرنا خودایێ مەزن ل سەر.

[٤] (غەفار) ئێك ژ ناڤێن خودایێ مەزنە و ڕامانا ئەوێ ژی ئەوە كو گونەها ژ ناڤ دبەت.

خودا هەر ئەم دکین گازین
دزانی ئەم بەلنگازین
ژ تە ڕەحمێ ئەم دخوازین
تو ڕەحما خوە بدە ئینسانی

ئیلاهی ئەم گونەهکارین
ل بەر ئەمرێ تە ئەم ژارین
نەساخین ئەم بریندارین
ل برینا مە بکە دەرمانی

ئەمێ[١] هەر کین و هەر بێژین
چما خوینا هەڤ درێژین
وەلاتێ خوە ئەم د سۆژین
گونەهـ ناکین ژ یەزدانی

گەلی کوردا گونەهـ بەسن
گونەهـ پیسن گونەهـ نەحسن[٢]
جزایێ گونەها نەکسن
بکن توبە و پەشێمانی

---

[١] ئەم دێ.

[٢] تشتێن نەخوەش.

## ڕۆژا طاڕی[1]

سپێدە دەرکەت کو تۆ هاتی
ڕۆژەك طاڕی[2] بی تۆ هاتی
خوەش خەلاتی بۆ مە هاتی
من اله الکائنات[3]

دنیا طاڕی بی تە ڕوون کر
صەنەمێ کوفرێ تە هوور کر
عەسکەرێ ڕۆمی تە کوور کر
جئت بخیر الیّات[4]

دێمێ تە هەیڤا ل چاردێ
ڕۆناهیا عەسمان و عەردێ
یا ڕەبی بدیمە مرادێ
بمن جاء بالمعجزات[5]

سەد سلاڤ سەر پێغەمبەرێ
شەفیعێ[6] ڕۆژا مەحشەرێ[7]

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٦/٤/٢١)ێ، ل بازێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

(٢) تاری.

(٣) واتە (ژ خودایێ هەبوونێن د ناڤ جیهانێدا).

(٤) واتە (ب باشترین نیشان و گڕۆڤ هاتی).

(٥) واتە (ئەوێ ب تشتێن خوەدی حنێر هاتی).

(٦) بەڕەڤان.

(٧) ڕۆژا قیامەتێ.

دێ بـــۆ مـــە كـــتن مـــەهـــدەرێ[١]
يــــــوم نـــــأتى بـــــالزلات[٢]

ڕۆژەكــــێ طـــەنـــگ[٣] و گرانـــە
ڕۆژا ل ســـــەر هنـــــداڤى وانـــــە
دژوار و گـــــــــەرم و خوهدانـــــــە
عنـــــد حشـــــرِ المخلوقـــــات[٤]

دويماهيـــــا پێغـــــەمبـــــەرانـــــى
تاجـــا ســـەر ســـەرێ حـــەميـــانى[٥]
خـــــودانێ قـــــەدر و ئێحســـــانى[٦]
هـــــاد مـــــن الظلمـــــات[٧]

يـــــا ئيلاهـــــى ل مـــــە ببـــــووره
بـــــۆ خـــــاترا نـــــەبيـــــێ بســـــپوور
تـــــۆ ژ عـــــەزابـــــێ مـــــە بكـــــە دووره
يـــــا بـــــديع الســـــموات[٨]

---

(١) بەرەڤانیێ.

(٢) واتە (دێ ب کێماسیڤە هێن).

(٣) تەنگ و بەرتەنگ.

(٤) واتە (خرڤەبوونا خەلکێ ل ڕۆژا قیامەتێ).

(٥) هەمیان.

(٦) قەنجی، باشی.

(٧) واتە (ڕێنیشاندەر ژ تارپاتیێ).

(٨) واتە (یا ئافراندەرێ ئەسمانان).

## چوونا[١] میعراجێ[٢]

موحـــەمـــەد قاصـــدێ[٣] ڕەبـــێ عـــەســـمانی
خـــــودانێ دینـــــێ پیـــــرۆز و قۆڕئـــــانی
خـــودێ گـــازیکرێ و بـــر بـــۆ عـــەســـمانی
گـــۆتێ ئـــەی قاصـــدێ مـــن تـــۆ مێهڤـــانی
بـــۆڕاق[٤] هـــات و گـــەهشـــتە پێغـــەمبـــەری
وی پـــێ خـــوە ل دیتنـــا چـــاڤێ خـــوە ددانـــی
ژ بەگحایێ[٥] ڕێکەت[٦] و گەها[٧] قدسێ
هنـــدی چـــاڤێ خـــوە ڕاکییـــوو تـــۆ دانـــی
دەمـــا هـــات گـــەهشـــت مسجد الاقصـــی
پێغـــــەمبـــــەر هـــــاتن و دانـــــێ تـــــەهـــــانی[٨]
پاشـــی ژ وێـــرێ بلنـــد بـــی بـــۆ عـــەســـمانی
چـــوو میعراجـــێ تـــەمامـــەن ب جسـم و جـانی
ئـــەوی دیـــتن گـــەلـــەك تشـــت و عـــەلامـــەت
خـــــودێ ژبـــــەر چـــــاڤێ وی پـــــەردە هلانـــــی

---

[١] چوونا پێغەمبەری بۆ ئەسمانی.
[٢] ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (١٩٩٦/٦/١٩)ێ، ل باژێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.
[٣] هنارتی.
[٤] ئەو دەوار بوو ئەوێ پێغەمبەر (س) لێ سووار بووی و چوویە ئەسمانان.
[٥] باژێڕێ مەکەهێ.
[٦] ب ڕێکەڤت.
[٧] گەهشت.
[٨] پیرۆزباهی.

یەك ژ وانا ئەوە نۆڕا[1] خودا بی

ئەوی دیت و بەلێ چو ژێ نەزانی

ڤەگەڕیا و هاتەڤە د نەفسا شەڤێدە

ئەوی دین و دیانەت بۆ مە ئانی

هزار هزار صەلاّت ل سەر ڕۆحا وی

هندی خیزێ چەما و ستێرێ ل عەسمانی

---

(1) ڕۆناهی.

## پاقژی[1]

هەرۆ سپێدێ تو زوی رابە
بشوو دەستا ل گەل چاڤا
بخوە نانی ل گەل چایێ
وەرە مەكتەب[2] ب سێ گاڤا
نەكە یاری ل سەر رێكا
ل ناڤ جوكا ل سەر ئاڤا
گەر تو پیس بی مە تو ناڤێی
خوە پاقژكە ژ سەر و چاڤا

---

[1] ئەڤ هەلبەستە ل سالا رێككەڤتی (١٩٩٦)ێ، ل باژێرێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن.

[2] قوتابخانە، خواندگەه.

## سەرۆکاتیا بارزانی[1]

کەیف و شانازی ئەڤرۆ یا مەیە
مەسعوود بارزانی سەرۆکێ مەیە
جەژنا پێشڕەوێ حەمی کوردایە
ئەو نیشانا کوردینیا مەیە
سەرێ مە بلندە سەرۆکمان[2] تویی
ئالا مە بەرزە[3] ژ مافێ مەیە
ئالا کوردایە ژ دەستێ قازی
تە ئەڤرۆ بلندکر هنداڤا مەیە
ئەمانەت گەهشتە جهێ مرادێ
بلا کورە بت نەیارێ مەیە
چاڤێت خوە ڤەکە دەیکا شەهیدی
ل دۆر خوە بنێڕە ئاهەنگا مەیە
خوینا شەهیدی ڕێ بۆ مە ڕۆنکر
چرا و خەتیرە ل بەراهیکا مەیە
سوپاس دەیکا شەهیدێ نەمر
هندی ئەم هەبین وێ ل بیرا مەیە

---

(١) ئەڤ هەلبەستە ل ڕێککەڤتی (٢٠٠٥/٦/١٤)ێ، ل باژێڕێ (زاخۆ) هاتیە ڤەهاندن. ئەڤ هەلبەستە ب هلکەڤتا دەستنیشانکرنا بەرێز مەسعوود بارزانی ل سالا (٢٠٠٥)ێ، وەك سەرۆکێ هەرێما کوردستانێ هاتیە نڤیسین.

(٢) سەرۆکێ مە.

(٣) بلندە.

کوردستان ب ڕەوشە ب پەرلەمانە

حوکمەت لە پێشە، داخوازا مەیە

پیرۆز و مبارەك خەلاتێ جوان

یەکەم سەرۆکێ، کری بەرخوەیە

جەژن و شەهیانا سەرکێشێ کوردە

هەر ئەڤ خەلاتە لائیقێ تەیە

## کەرکووك[1]

ئـەگـەر لـەشـێ تـە سـاخ نـەبـت
کـێم و کاسـی لـێ هـەبـت
دۆسـتەك هـەبـت سـەك نـەبـت
ئـەڤـی چـەوا دێ ژیـن هـەبـت

کوردسـتانا مـە زەنگلـە
باغـە بـۆ نێرگـز و گولـە
هـەر لـێ دخوینـت بلبلـە
کـەرکـووك نـەبـت ئـەو بـێ دلـە[2]

چـاڤ و دەڤ و گوهـ و دفـن
ئـەو ئـەنـدامێت لـەشـێ منن
دۆروبـەرێـت مـن دۆژمـنن
دۆزا وان سـەر دلـێ مـنن

---

[1] مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین.

[2] ئەڤە ژ گۆتنا مەلا مستەفا بارزانی ئەوا دبێژیت: "کەرکووك دلێ کوردستانێ یە) هاتیە وەرگرتن.

## دەرگەهـ ڤەبین[١]

دەرگــەهــ ڤــەبــین گــەلــی بــرا
تــاری نـــەمـــا هلبـــین چـــرا

یـــا مـــە دڤیـــا وا بـــۆ مـــە هـــات
چـــاڤێ نـــەیـــارێ مـــە دەرهـــات

شـــەڕ و خـــەباتـــا مـــە کـــری
کوردســـــتانا ئـــــازاد کـــــری

پێوســـــتە ئـــەم هشـــیار ببـــین
مـــا بـــەس نینـــە ڕزگـــار ببـــین

شـــەهیـــد و کوشـــتن و ســـۆتن
نـــەخـــتن ئـــەڤـــە بـــۆ ســـەرکـــەتـــن

بـــرین و خوینـــا هـــــەولێـــرێ
نـــەیـــار ســـەرژێکـــرن ب کێـــرێ

حـــەلـــەبچـــە و کێمیـــا و ئـــەنفـــال
بـــەســـن ئـــەڤـــە بـــۆ ئیســـتیقلال[٢]

نـــەیـــار بمـــرت لێڤـــە نـــابین
بـــلا بمـــرت ژێڤـــە نـــابین

---

[١] مێژوویا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتیە نڤیسین.

[٢] سەرخوەبوون.

گـــەميـــا مـــە هاتـــە كـــەنـــدالى
دۆژمــــــن بــــــلا هـــــەر بنــــالى

ســــەربـــەخـــۆيى مـــــافێ مــــەيـــە
ڤـــان نـــەحـــەزا شــــۆلەش[1] مــــەيـــە

كوردســــــتان ڕەوشـــــا ژيــــــان
كـــەســـەك نـــەڤێـت ئـــيللا خـــودان

نــــــەورۆز واهـــــــات شـــــــل و ملـــــــە
جـــەژنـــا نـــەورۆز ئــــەڤـــرۆ ژ دلـــــە

قوريــــــان مـــــەدان بـــــۆ ڤـــــێ دۆزێ
بـــــــۆ كوردســـــــتان و نــــــــەورۆزێ

---

[1] شۆلەژ.

## ئازاديا كوردان[1] (حريه الكورد)[2]

الله اكبر يا خالق العباد
الله اكبر يا محرر الاكراد
سوپاس بۆ خودايێ مێهربان
كو دامە هەژاران ژيان و شادى

جعلت حقد الحاقدين ظلاله
وانقذنا من بطش الاعادي
دەردێ مە كوردا چراك مە هلبت
سەرێ خوە هلدين طامكين[3] ئازادى

انظروا كيف كبت الحاقدين
الذين هم طغوا في البلاد
داديێ تۆ بكە دا هەر بمينى
ئەگەر ڕاستى هات خوە ژێ نە لادى

عصابة البعث عتوا و افسدا
فأهلكوا بظلمهم والفساد
هەر كەس ب گەلێ خوە زالە
ئەوێ گەل نەبت لاوێ شەلاندى

جرائم البعث من الكورد هزت

---

(١) هەلبەستڤانى ئەڤ هەلبەستە ب هەر دوو زمانێن كوردى و عەرەبى نڤيسيە.

(٢) مێژوويا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتيە نڤيسين.

(٣) تەماكين.

مشـــــاعر الــــــدنيا وضـــــمير العبـــــاد

نــــــــهبــــــه كــــــوریٚ رۆژیٚ ب تنــــــیٚ

تـــو دویـــر بنێـــڕه گـــهر بڤێـــت ئـــازادی

قـــد أصـــبحوا فئرانـــا فـــي حجـــورهم

أخرجـــوا منهـــا فـــي تكريـــت والرمـــادي

ئـــهگـــهر تـــو ژيـــری ل ڤانـــا بنێـــره

چـــهوا بـــهلاڤ بـــين وهك نوكـــا قـــهلانـــدی

لـــو كـــانوا عـــدولا فيمـــا أنـــيط بهـــم

لمـــا اســـتحقوا الاهانـــة فـــي القيـــود

رێيـــا ڕاســـت تـــو بگـــره و هـــهرِه بـــهرێڤـــه

ســـهریٚ خـــوه ڕاكـــه نـــه ســـهر نزمانـــدی

# مللەت[1]

مللەت كە ڕابى سەر خوە
قايم سەكنى سەر هەر دوو پێ خوە
گۆرە گرێدا كالك كر پێ خوە
ساجۆر گرێدا و چەك دا ملێ خوە
زانى درێژە ڕێ دايە بەرخوە
بەلێ گوهـ نەدا زەحمەت و وەستانا خوە
مەبەست مەزن بى كربى دلێ خوە
ئارمانج ژيان بى دا بەر چاڤێ خوە
ئومێد و هيڤى ڕزگارى وەلاتە[2]

---

(1) مێژوويا ڤەهاندنا ئەڤێ هەلبەستێ نەهاتيە نڤيسين.

(2) ل دويڤ دەستنڤيسێ هەلبەستڤانى وەسا ديارە دبيت كو ئەڤ هەلبەستە ب داوى نەهاتيە.

## ليلة الاسراء والمعراج[1]

سـبحانك ربـي انـت القـدير
تفعـل مـا تشـاء و انـت الخبيـر
سـبحان مـن اسـرى بعبـده لـيلا
الـى المسجد الاقصى كأنـه يطير
أتـى بـالبراق ليركـب عليـه
فـلا هـو بغـل ولا هـو حميـر
يضـع رجلـه فـي منتهـى طرفـه
ويسـير اسـرع ممـا يطيـر
وصـل الامـين برفقـة الامـين
لحكمـة قضاها السميع البصير
هنـاك قـد اسـتقبله الانبيـاء
فصـلى بهـم البشـير النـذير
أتـاه جبريـل بلـبن و خمـر
اخـذ اللـبن هـو بـالأمر خبيـر
فأختـار لأمتـه الفطـرة ابـدا
فهـو حـريص عليهـا وبهـا جـدير
عـرج بـه للسـموات العـلا
دعـاه اليـه العلـي القـدير

---

(١) "بسم الله الرحمن الرحيم سبحان الذي اسرى بعبده ليلا من المسجد الحرام الى المسجد الاقصى الذي باركنا حوله لنريه من آياتنا انه هو السميع البصير". سورة (الاسراء) آية (١).

